د.عەلی شەریعەتی

# خۆشویستن

## لە عەشق باشترە



و: محەممەد باخەوان

# خۆشویستن

# له

# عەشق بانترە

د.عەلی شەریعەتی

و: محەممەد باخەوان

ناوی کتێب: خۆشویستن لە عەشق بانترە

وەرگێر: محەممەد عەبدوڕەحمان (باخەوان)

دیزاینی بەرگ و ناوەوە:زانیار هەڵەبجەیی

چاپخانە:گەنج

ساڵی چاپ:٢٠١٠

ژمارەی سپاردن: (٢٤٢٥) ساڵی ٢٠٠٩

پێشکەشە بە:-

-گیانی بەرزوپیرۆزی کاروانچی کاروانی
خۆشەویستی

-گیانی پاكو بەرزەفڕی عەلی شەریعەتی

-ڕێبوارانی ئەویندارییی کاروانی خۆشەویستیی
ڕاستەقینە

-هەر خۆشویستو خۆشەویستێکی بەڕاستی

-خۆشەویست... س.م

## پێشەكی:

خـەریكی خوێندنـەوەی كتـێبی (هونـەری خۆشویـستن)ی (ئـەریك فـرۆم) بـووم، كـە تیایـدا بـە ڕیزبەنـدی كەسـانێكی وەك كێنـتو كـێ یێـر كـێ گـوردو سـاتەرو كـامۆ، هەوڵـدەدات تـاوەكو بـە قـازانجی ئـەو (هیومـانیزم)ە بەرفراوانـەی كـە بانگێـشتی دەكـات _ تەفـسیرو پاسـاوی ئەوینـەكان بداتـەوەو، بـە ئـەو بەیانـە جـوانو

دەرونزانییە هونەرمەندانەی کە هەیەتی، خەزیکی شیکاری ڕێنماییانەی ئەوینەکانە، بە سوودی (مرۆڤایەتی)و بە قازانجی (کۆمەڵگە)! من لەو پێڕستە گشتگیرەی کە ئەو، لە هەموو جۆرەکانی ئەوین داویەتی، لە ئەوینی ژنو پیاو، خەڵكو نیشتمانو باوكو منداڵو مرۆڤو خودادا...

هەرچی گەڕام ئەوەی کە دڵی من ساڵانێکە ئاشنایەتیو ئەویش **تەنها ئەوینێکە زادەی مرۆڤە**، کە ئەوینەکانی دی هەموو سەپاندنی سروشتو پێویستیی (بوون وئەفراندن)ە، چونکە هەموو ئەو مەعشوقانە سروشتمان بۆ دیاری دەکات

وغەریزە کە فەرمانبەر(ڕاسپێردراو)ی ئەوە

_ ، بێخۆ، دنەمان دەدات کە ئەوین

بکەین و تەنها یەك ئەوینە کە ئەو ( منە

بێگەرد و ئازادو دڵسافە) مرۆییانە، ئەو

خودی خودەمان، بەبێ سەپاندنی سروشت

و داخوازی میزاج و بەرژەوەندی و سوود، (

هەڵدەبژێرێت و بڕیاردەدات)و ئەوە

کێشمەکێش ڕازئامێزی دوو ڕۆحە کە چێژی

شاراوەی نزیکایەتی بەکی سەیر یەکتری

دەبەن و دەچێژن_ کە بێخ و بناوانەکەی لە

جیهانێکی دیکەدایە_و ڕەنگی

هاونەژادییەکی بان و باڵایی( ماورایی)

لەسیمای یەکدیدا دەبینن و هەروەك دوو

هاونیشتمانی، نائاگا، لەم وڵاتی نامۆی ژیانەدا، هەروا بە ڕێکەوت، دەکەونە سەرەڕێی یەکترینەوەو لە یەکەمین ژوان و دیداردا، یەکتری دەناسنەوەو هەرسات، هێڵەکانی ئاشنایەتی و خزمایەتییەکی قووڵ و ڕۆشن _کە حاشا هەڵنەگرە_ لە یەکتردا دەخوێننەوەو پەیوەندییەکی ئالەم چەشنە، نە لەو جۆرە ئەوینانەیە کە بێتە بەرچاوی ئەریك فرۆم کە هیومانیستەو هیزمانیزم، بەهەرحاڵ، تێکڕابینێکی ساویلکەو دڵسادەیەو چ ئاگایی و هەواڵێکی هەیە لەوەی کە بە هەندێ( دەرون و ناخ)ەکاندا تێدەپەڕێ؟و چی دەزانێت کە

لەو ئەوینانە کە هەمووی کۆمەڵێك فرۆفێڵە

تاوەکو مرۆڤ بکاتە خزمەتگوزاری

سروشتو نۆکەری کۆمەڵگە، **ئەوینێکی**

**بانتروگەورەتریش بوونی هەیە** کە بە

وێنەی ئەوینەکانی دی ئامرازی کار نییەو

ئەویش ئەوینی مرۆڤە بۆ مرۆڤ، ئەوینی

ڕۆحێك بۆ ڕۆحێکە. ڕۆحێکی تەنهاو ئاتاج

بە ڕۆحێکی قەشەنگو گرانبەهاو

دەوڵەمەند، ئەوینی خزمێك بۆ خزمەکەی

خۆی، لە ئاپۆرای دروستکراوەکاندا کە

هەروەك مێرووەکان لە زەوی هەڵدەتۆقێنو

هەریەکە بە بەرژەوەندییەکەوە لەم

ڕۆژگـاره ئالوودەیـەدا، لێـك دەنـاڵێنو پـێچ دەکەنەوەو دەمرن.

پـێم حـەیف بـوو کـە ئـەویش نـاوی ئـەوینیی لـێ بنـێم کـە شـاعیرەکان ئالوودەیـان کـردووە. ویـستم بـە (ڕێزلێگـرتن)ی نـاوزەد بکـەم، مـەلاکان بێنرخییـان کـردووە. گـووتم باشـترین ووشـە لێـرەدا (نزیکایـەتی)ە، نزیکایـەتی دووڕۆح، دوو بێگانـە: بـەو ناسـکییە جوانییـەی کـە لـە پێکهاتـەی ئـەو ووشـەیەدا هەیـە: (نزیـك)و (ایـەتی))! ترسـام کـە تێنەگـەن. بەهـەر حاڵ دەڵـێم : **خۆشویـستن** . مەبەسـتم ئـەوینو( ڕێزلێگـرتن)و ئیمـانی دوو ڕۆحـی ئاشـنای

نزیکە. دوو (مرۆڤ)ی کە جگە لەو هەوێنە خاوێن و بێگەرد و پوختەی کە (منی مرۆیی پوخت)ی هەرکەسێك دروستدەکات، هیچ بەرژەوەندی و پێوستی(زەرورەتێك) پێکیانەوە نابەستێتەوە و گرێیان نادات، پەیوەندییەك کە نە سروشت، نە ئەفرێنراو (دروستکراوان = خلقت)، بەڵکو تەنهایی نێوان دوو تەنهای لێکنزیکی پێکەوە بەستووە ... و نازانم چی بڵێم؟ بەهەر حاڵ ، ئەوەی من لە ماسینیۆن لە کرۆکی ئێسقانمدا، لە قوڵایی فیترەتمدا، هەستی پێدەکەم. ئەوەی کە لە ژیانیدا هەستم پێدەکرد هەر ڕۆژ ، لە دەستی ئەودا ، بە

ئەو (نازانم لە کوێدای)ە کە هەردەم لە داخ و حەسرەتی دوورکەوتنەوەیدایین، نزیکتر دەبمەوە، و لە نیگایدا، ئەو (نازانم کە)یە دەبینم کە هەمیشە لە چاوەڕوانی بەدەستهێنانەوەیدا ئۆقرەمان لێبڕاوەو ئەمێستا، پێنج ساڵە کە هەموو ڕۆژێک لە مەرگیدا تازیەبارم و تادێت، لە ڕۆژی ئەو (کارەساتە) نزیکتر دەبمەوە.

**ئەو بوو کە منی فێر کرد کە:**

خۆشویستن لە ئەوین بانترە.

ئەوین(عەشق) خرۆشێکی کوێرەو پەیوەندییەکە لە ڕووی نابیناییەوە. بەڵام خۆشویستن پەیوەندییەکی خودئاگاییانەیەو لەڕووی بیناییەکی ڕوونو خاوێنەوە. ئەوین زیاتر لە غەریزەوە سەرچاوە دەگرێتو هەرچی لە غەریزەوە سەرهەڵبدات بێ بایەخەو خۆشویستن لە ڕۆحەوە هەڵدێتو تا هەرکوێ کە ڕۆحێك بەرزیو بڵندیی هەیە، خۆشویستنیش هاوهەنگاوو شانبەشانی ئەو بەلوتکە دەگات.

## خۆشویستن لە ئەوین بانترە

ئەوین لە زۆربەی دڵەکاندا، شێوەو فۆرمو ڕەنگی تاڕادەیەك وێکچووو هاوشێوەوە دەردەکەوێتو دارای کۆمەڵێ سیفەتو حاڵەتو ڕواڵەتو دیمەنی هاوبەشە، بەڵام خۆشویستن لە هەر ڕۆحێکدا پرشنگو درەوشانەوەیەکی تایبەتی خۆی هەیەو لە ڕۆحەوە ڕەنگ دەگرێتو لە بەر ئەوەی ڕۆحەکان، بە پێچەوانەی غەریزەکانەوە، هەرکام ڕەنگێكو بڵندییەك و ڕەهەندێكو تامو چێژو بەرامەیەکی تایبەتی خۆیان هەیە، دەتوانین بڵێین بە ژمارەی هەر ڕۆحێك، خۆشویستنێك هەیە.

ئـەوین لەگـەڵ ناسنامەدا بێ پەیوەندی نییـەو تێپـەڕبوونی وەرزەکـانو ڕۆیـشتنی ساڵەکان کاری تێدەکات، بـەڵام خۆشویستن لـەودیو سـاڵو تـەمـەنو زەمـەنو میزاجـەوە دەژیو ڕۆژو ڕۆژگـار دەسـتی بـە هێلانـەی بەرزو بڵندی ڕا ناگات.

ئەوین، لە هەر ڕەنـگو ئاسـتێکدا، لەگـەڵ جوانییـەکی بەرهەسـتدا، بـە نهـێنی یـان ئاشکرا، لە پەیوەندیدایە. هەربـەو چەشنەی کە شوبنهاوەر دەڵێت: (تۆ وەرە بیست ساڵ بخـەرە سـەر تەمـەنی مەعـشوقەکەتەوە، ئەوکات لەسەر کاریگەری ڕاستەوخۆی ئـەوە بەسەر هەستتەوە تێبینی بکە!)

بەڵام خۆشویستن ئاوەها لە ڕۆحدا شۆڕو مات بووەتەوەو کەمەندکێشی جوانییەکانی ڕۆحە کە جوانییە بەرهەستەکان بە جۆرێکی دی دەبینێت.

ئەوین زریانیو شەپۆلاویو قەلەمون سیفەتە، بەڵام خۆشویستن ئارامو دامەزراوو سەنگینو لێوانە لە نەجابەت.

ئەوین لەگەڵ دووریو نزیکیدا لە هەڵکشانو داکشاندایە- ئەگەر دووری لەیار درێژە بکێشێت لاواز دەبێت، ئەگەر پەیوەندیو پێکەوەبوون بەردەوامبێت ڕوو لە سووکیو پووچبوون دەکات.و تەنها بە ترسو ئومێدو ترسولەرزو شێواوی( ژوانو

پارێزکردن) زیندووو بەهێز دەمێنێتەوە.

بەڵام خۆشویستن لەگەڵ ئەم حاڵەتانەدا

ئاشنا نییە. دونیای ئەم دونیایەکی ترە.

ئەوین جۆش و خرۆشێکی یەکلایەنەیە.

بیر لە مەعشوق ناکاتەوە کە کێیە؟

(خودجۆشێکی خودی)ە، و لەم ڕووەوە

هەمیشە بەهەڵەدا دەڕوات و لە هەڵبژاردندا بە

خەستی و سەختی هەڵدەخلیسکێ و یان

بەردەوام یەکلایەنە دەمێنێتەوە و هەندێجار

لە نێوان دوو بێگانەی لێک جیاوازدا، ئەوینێک

چەخماخە لێدەدات لەبەر ئەوەی لە

تاریکییدایەو یەکدی نابینن، لەدوای

تەقینەوەو بزیسکەی ئەم بروسکەوەیە کە لە

تیشکی ڕۆشنایی ئەودا دەتوانن ڕوخساری یەکتری ببینن و لێرەدایە کە هەندێکات، لەدوای چەخماخە لێدانی ئەوین، عاشق و مەعشوق کە لە ڕووخساری یەکدی ڕادەمێنن، هەستدەکەن کە یەکدی ناناسن و بێگانەیی و نامۆیی(نا ئاشنایی) دوای ئەوین _ کە دەردو ژانێکی بچوك نییە _ فراوان و زۆر بەرچاوە.

بەڵام خۆشویستن لە ڕۆشناییدا ڕیشە دادەکوتێت و لەبەر نووردا شین دەبێت و گەشە دەکات و لەم ڕووەوەیە کە بەردەوام لە دوای ئاشنایەتییەوە ڕوودەدات، و لە ڕاستیدا، لە دەسپێکدا، هەردوو ڕۆحەکە

هێڵـەکانی ئاشـنایەتی لـە سـیمای نیگـای یەکتریـدا دەخوێننـەوە،و لـە دوای (ئاشنابوون)ە کە (خۆمانە) دەبنەوە. دوو رۆح، نـەك دووکـەس، کـە ڕەنگـە دووکـەس پێکەوە لەگەڵ کۆمەڵێك لە ڕووگیرییەکاندا هەسـت بـە (بەخۆمانـەبوون) بکـەن و ئـەم حاڵەتە بە ئەندازەیەك ناسك و سرکە کە بە ئاسانی لەژێر دەستی هەست و دەرککردن هەڵدێ و پاشان چێژی ناسیاوی و بەرامەی نزیکایەتی و گەرمیی لێکنزیکیی لە قسەو کرداروو ئاوازی قسەکانی یەکتردا هەست پێدەکرێت و لەم قۆناغەدایە کە لەناکاو، خۆبەخۆ، هەردوو ڕێبوارەکە بە چاو دەبینن

کە بە بەهەشتی بێسنووری میهرەبانی گەیشتوون و ئاسمانی سامان و بێگەردو خاوێنی خۆشویستن بە ڕاسەریانەوە دەواری هەڵداوە و ئاسۆی ڕوون و پاک و بێگەردی (ئیمان) بەڕوویاندا دەکرێتەوە و شنەیەکی نەرم و ناسک _ هەروەک ڕۆحی پەرستگەیەکی وێرانە کە لە میحرابی پەنهانەکەیدا، خەیاڵی ڕاهیبێکی گەورە لەسەر زەوی نەخشی بەستووە و وورتەورتی بەسوێی پاڕانەوەی منارە تەنهاو غەریبەکەی دەهێنێتە لەرزەو حەشۆکە- هەرسات پەیامی ئیلهامە تازەکانی ئاسمانەکانی دی و وڵاتەکانی ترو بۆن و

بەرامەی گۆڵە نادیارو گیان ڕفێنەکانی باخچەکانی دیکەی لەگەڵ خۆیدا پێیەو، بە میهرو نازێکی کارامەو شیرین‌و شۆخەوە، هەرسات، خۆی دەدات بەسەرو ڕووی ئەم دوانەدا.

**ئەوین**، شێتیەو شێتی شتێك نییە جگە لە وێرانبوون‌و پەرێشانی (**تێگەیشتن**)و (**بیرکردنەوە**). بەڵام **خۆشویستن**، لە ترۆپکی هەڵکشان‌و میعراجیدا، لە سنووری ئاوەزوعەقڵ بانتر دەڕوات‌و تێگەیشتن‌و بیرکردنەوەیش لە زەوی هەڵدەگرێت‌وبەرزی دەکاتەوەو لەگەڵ خۆیدا دەیبات بۆ لوتکەی هەرەبەرزی ڕۆشنگەری (ئیشراق).

## خۆشویستن لە ئەوین بانترە

ئەوین جوانییە دڵخوازەکان لە مەعشوقدا دەخولقێنێتو خۆشویستن جوانییە دڵخوازەکان دەبینێتو بە دیدەکات.

ئەوین فریوێکی گەورەو بەهێزەو خۆشویستن ڕاستگۆییەکی ڕاستەقینەو بێگەرد، بەبێ کۆتاییو ڕەها.

ئەوین لە دەریادا نغرۆبوونەو خۆشویستن لە دەریادا مەلەکردن.

ئەوین بینایی دەگرێتو خۆشویستن دەیبەخشێت.

ئەوین زبرو توندوتیژەو لە هەمانکاتدا ناپایەدارو نادڵنیایەو خۆشویستن ناسکو

نەرمونیانەو لەهەمانکاتدا پایەدارو لێوان لە دڵنیاییە.

ئـەوین بـەردەوام ئـالوودەی گومانـەو خۆشویستن سەرلەبەر بڕواو یەقینەو گومان لـەخۆ ناگرێـت. تـا زیـاتر لـە ئـەوین نۆش دەکـەین، تێراوتـر دەبـین‌و لـە خۆشویـستن هەرچەند زیاتر، تینوترو بەتاسـەتر دەبـین. ئـەوین تاچـەند درەنگـتر بخایـەنێت کۆنـەتر دەبێت‌و خۆشویستن نوێتر دەبێتەوە.

ئـەوین هێزێکـە لـە عاشـقدا، کـە بـەرەو مەعـــشوق کەمەندکێـــشی دەکـــات؛و خۆشویـستن کێشندەیەکە لـە دۆسـتدا، کـە دۆسـت بـۆ لای دۆسـت دەبـات. ئـەوین، بـە

## خۆشویستن لە ئەوین باشترە

خـــاوەنبوونی مەعـــشوقەو خۆشویــــستن تینویەتیی لە دۆستدا توانەوەیە.

ئــەوین دەیــەوێت مەعـــشوق نــەزانراوو بزرناوبێـت، تـاوەکو بـۆ ئـەو پـاوان ببێـت، چـونکە ئـەوین جیلوەیـەك لەخۆپەرسـتیو ڕۆحی کاسبکارانە یان جانەوەرانەی مرۆڤە،و لەبەرئەوەی کە لە خراپـەی خـۆی بەئاگایـە؛ کە لە ئەویدیدا دەیبینێت لێی بێزار دەبێـتو ڕقوکینە لەدڵ دەگرێـت. بـەڵام خۆشویـستن دەیـەوێت دۆسـتەکەی خۆشەویـستو ئـازیز بێتو.دەیەوێت کە سەرجەم دڵـەکان ئـەوەی واکـە ئـەو سـەبارەت بـە دۆسـت لـە خۆیـدا دارایەتیو هەیەتی، هەیانبێت. لەبەر ئـەوەی

کە خۆشویستن جیلوەیەکە لە ڕۆحی خودایی و فیترەتی ئاهورایی مرۆڤو، لەبەرئەوەی خۆی بە پیرۆزی و بێ لەکەیی باڵایی( ماورایی) خۆی بینایە، کە ئەوە لە ئەویدیدا دەبینێتەوە، ئەویشی خۆشدەوێت و بە ئاشناو خوێشی دەبینێتەوە.

لەئەویندا ڕکابەر بێزراوە،و لە خۆشویستندایە کە( هەوادارانی مەڵبەندی یاریان وەك گیانی خۆیانە، کە ئێرەیی نیشانەی زەقودیاری ئەوینە، چونکە، ئەوین مەعشوق بە نێچیری خۆی دەبینێتەوەو هەمیشە لە پەرێشانیدایە کە ئەویدی لە چنگی نەیرفێنێ و ئەگەر ڕفاندی، ئەوا لەگەڵ

هەردوکیانــدا دوژمنایــەتی دەکــاتو مەعــشوقیش هــەروا بێــزراو دەبێــت،و خۆشوێـستن بــاوەڕ(ئیمــان)ەو بــاوەڕیش رۆحێکی ڕەهایە، ئەبەدییەتێکی بێسنوورە، لە تۆرەمەو ڕەگەزی ئەم جیهانە نییە.

ئەوین پەتی سروشتەو سەرکێشەکان بە خۆیــەوە دەبەستێتەوە تــاوەکو ئــەوەی ئــەوان، لــە سروشــت بــەخۆیان گرتوویانــە پێیبدەنەوەو ئەوەی مەرگ زەوتــی دەکات، بــە فێڵــی ئــەوین، دای بنێنــەوە، کــە ئــەوین قەرزبــژێری مردنــە،و خۆشویــستن ئەوینێکــە کە مرۆڤ، بە دوور لە چاوی سروشــت، خــۆی دەیخولقێنێت، خۆی پێیڕادەگات، خۆی ئــەو

(هەڵدەبژێرێت). ئەوین لە داوی غەریزەدا دیلبوونەو خۆشویستن بریتیە لە ئازادی لە جەبری میزاج. ئەوین خزمەتکار(فەرمانبەر)ی گوێ لەمستی جەستەیەو خۆشویستن پێغەمبەری ڕۆح.

ئەوین بێئاگا(ئیخفال)کردنێکی گەورەو بەهێزە تاوەکو مرۆڤ بە ژیانەوە سەرقاڵ بێت و بە ڕۆتینیاتەوە خەڕۆ بێت کە سروشت زۆر حەزی لێیەتی،و خۆشویستن زادەی ترس لە نامۆییەو خۆدئاگایی ترسهێنەری مرۆڤە لەم بێگانە بازاڕە ناشیرین و بێهودەیە.

## خۆشویستن لە ئەوین باشترە

ئەوین بەدوای چێژوەبوونەو خۆشویستن هەودای پەنا دۆزینەوەیە. ئەوین نانخواردنی چلێسێکی برسییەو **خۆشویستن( دیتنەوەی هاودەمێکە لە وڵاتی بێگانەدا).**

لە شانۆییەکدا پاڵەوانێك، لەبەرامبەری پادشاوە، بۆ نمایشکردنی تیژیو بڕستی شمشێرەکەی، شیشێکی پۆڵای داناو، بەیەك لێدانی شمشێرەکەی، قاشی کردو کردی بە دوو کەرتەوەو هەمووانی مات و سەرسام کرد؛ پادشا ئاوریشمێکی نەرم و ناسك_ کە بەوێنەی پەڵەهەورێکی بەیانان سپی، ناسكو سووك بوو_ هەڵیدا بە حەواداو پەردەی ئاوریشمەکە لە کاتێکدا وەك تۆپەڵە

دووکەڵێکی بەسەریەکدا کەوتوو لە لە حەوادا
بە ئارامیو جوانیو ناسکی ڕۆحی شاعیرێك،
دەکرایەوەو دەپشکوت_ پادشا، بە نەرمیو
ئـــارامیو ســـەنگینیو دڵنیاییـــەوە،
شمـشێرەکەی بــە نێویـدا تێپەڕانـدو، بـێ
ئەوەی هەست بە کەمترین بەرگریـەك بکات،
پەردەی ئاوریشمەکە بوو بە دوو بەشـەوەو
هەرلایەکی لە هەوادا، بەرەو لایـەك ڕۆیشتو
لە تێپەڕبوونی شمشێرەکە بە ناو دڵی پەردە
ئاوریشمیەکەدا کەمترین لۆچێکی تێنەکەوتو
وەك بڵێـــی هەســـتی بـــە تێپـــەڕبوونی
شمـــشێرەکە بـــە هەناویـــدا نـــەکرد،
شمشێرەکەیش ئاوەها تێپـەڕدەبوو کـە وەك

## خۆشویستن لە ئەوین بانترە

بڵێی بە نێو دڵی پارچە هەورێکی بەرەبەیانی بەهارییی، یان تۆپەڵە دووکەڵە سپییەکانی جگەرەی شاعیرێکی! ڕۆچوو لە بازنەی خەیاڵدا، تێپەڕدەبێت.

ئاه! کە لە ووشەبازیو دارشتن دەستەوسانم کە ئەوین کام شمشێرەو خۆشویستن کامە شمشێر. بمبوورن کە ناتوانم، من یاوەری ماسینیۆنم کە لە هەمبەر ئەم جۆە شتانەوە پەرێشان دەبوو. قەشەنگی، ناسکی، ئەو شتەی ڕەنگو بۆنو تامی نامادیترو نائاساییترو نا زەمینییترو بێ کەڵکتری هەیە ڕۆحی ئازار دەدا.

بریا دەمتوانی لیستێکی ئەو شتانەی کە فرمێسک بە چاوی ئەودا دەهێنێ بنووسم‌و هەرهەموو لەیەك جێدا تۆماربکەم. ئەوکات شتێکی ناوازەو شیرین دەبوو بۆ خوێندنەوە. لانیکەم بۆ هەستکردن‌و هەستپێکردنی زبری‌و نەرمی‌و ڕەگەزو ڕەنگ‌و بۆن‌و بەرامەو هەستیارییەکان،و وەك دەڵێن: بەکاری خاڵە لاوازەکانی ڕۆحی ئەو دەهات. ڕۆحێك وەك ئەسپێك وەهایە ( ئەڵبەتە ڕۆحیش هەیە وەك کەرێك یان هێسترێك، یاخود گایەك ، یا سەگێك ، یان ڕێویەك، یاخود کەڵەشێرێك، یان مەڕێك، یا گورگێك، یاخود داڵەکەرخۆرەیەك، یان

کەمتیارێک، یاخود زالویەک، یان مشکێک (زۆر کەسان)ن یان پڵنگێک، یاخود شێرێک یان شەهێنێک، یا بەبوویەک، یا چۆلەکەیەک، یا بەرازێک، یا ورچێک، یاخود پشیلەیەک، یان قومقومەیەک، یاخود پەپوسلێمانەیەک یا پەروانەیەک، یا مێرولەیەک، یا فیلێک، یاخود وشترێک(زۆرکەس) یان ووشترمەلێک! یان قەلەمونێک، یاخود ( وشتر _ گا _ پڵنگ)ێک، یان مژمژەیەکی کەڵەشێری، یان تۆوێک، یان پەتاتە، یاخود فیلە خوێڕییەک، یان کرمێک، یان.... بنێشتێک! ! {بڕوانە . وتاری بنێشتی خروس نشان} ، یاخود دەریا، یا جەنگەڵ، یان خانوویەکی نوێی خنجیلانەی جوان {بڕوانە

وتاری پەیڤەکان مرۆڤەکان} و یان کاروانسەرایەکی چۆڵ‌و وێرانەی کۆن، یاخود ئاگرێک{و دابەشکردنە ووردترەکانی بۆ جۆرەها پارچە ئاگری بچوك‌و گەورەو هەمەجۆر،و هەروەها جۆرەکانی لە ڕووی خانەوادەو توخمەوە: نەوت، پیو، ڕۆنی چرا، ئەلکحول، گازۆیل، بەنزین، دارو جۆرەکانی: هەر لە کۆتەرەی تاق‌و چڵ‌و چێوو لق‌وپۆ وشکەکانی قەیسی‌و تووەوە تاوەکو داری(سەندەل)و...هتدوئەو ئاگرانەی کە لە شتانی دیکەوە دەکەونەوەو شتانی دی‌و سووتەمەنییەکانی دیکەو پزیسکەکانی ترو بروسکەکانی دی‌و بزوسکەو بزیسکەکانی دیکە و ئۆۆۆۆۆۆە}و

پۆلێنکردنی دیکەی ئاگرەکان، نەك ئاگەر دووکەڵدارەکان، بۆندار، ئاگرە بێ دوکەڵەکان، بێ بۆنەکان( مارج من نار)، ئاگرە شین، سوور، سپی، سەوز....و ئاگرە بێڕەنگەکان. ئاگرە بەرهەستەکان، ئاگرە نەبینراوە نابەرهەستەکان...و ئاگرە سووتێنەرو ئاگر داخ و ئاگرە تاریککەرەوەو ئاگرە ڕووناککەرەوەو ئاگرە بێ داخیە، بێ گەرمییەکان، ئاگرە....کان و ئەو ئاگرانەی سووتێنەر نین. ئاگرە سارد، فێنککەرەوە، باش، پاك، ڕووناك، نەبینراوەکان.. نەیرەوانا ئاگری ئەوین لە خوادا!! چ کەسێك پەی بە ئەمە بردووە؟ ئاگری ئەوین

لە ڕۆحی خوادا، ئاگرێك كە هەر هەموو گەردوون درەوشانەوەو دەركەوتن( تەجەللای)ی ئەوە، ئاگرێكی گەرم نییە، داخ نییە. بۆچی؟ ئاتاجمەندی لەودا نییە، شەپۆلانی تێدا نییە، نامەحكەمی، گومان، لە رزۆكی، دوودڵی، هەڵبەز و دابەز، دڵەڕاوكێ، پەشێوی... نیگەرانی، لەودا نییە، بەڵام ئاگرە، ئاگرینتر لە هەر ئاگرێك، ئاگرێك كە پریشكی یەك بڵێسەی بریتیە لە بوونەوەر(گەردوون)، سێبەرەكەی ئاسمانە، دەركەوتنەكەی كائیناتە، تۆزوگەردیخۆڵەمێشە ناسكو بچوكەكەی بریتییە لە كاكێشانەكان....

## چی دەڵێم ؟ !!!

ئەمەیە **ئاگری ئەوین لە خوادا**! یانی چێ؟ ئاگری ئەوین خۆ بەمجۆرە نییە...کەواتە ئەمە **ئاگری خۆشویستنە**.

بەڵێ، ئاگری خۆشویستنە، سەیرە!؟

منیش وەك سەرجەم عارفەکانو شاعیرەکان قسەم دەکرد: **ئاگری ئەوین**!؟ ئەویش لەخوادا!؟ نەخێر، ئاگری خۆشویستنە کە داخ نییە، سارد نییە، گەرموتینی نییە، بۆچی؟ چونکە ئاتاجمەندییو پێویستیی نییە؛ لەبەر ئەوەی مەرامی نییە؛چونکە گەیشتنی نییە، چونکە بەدیکردنو پەیبردین نییە، لەبەرئەوەی ونکردنی نییە، چونکە

بەدەستهێنانی نییە، لەبەرئەوەی بەکەڵکهاتن و بەدەردخواردنی نییە، چونکە هەوکردن و پەشێوی نییە، بۆوەی شەپۆلانی نییە، چونکە گومان و دوودڵی نییە، لەبەرئەوەی دوورو نزیکی نییە، چونکە بیم و ئومێدی نییە، چونکە مردن و ژیانی نییە، لەبەر ئەوەی بەهێزی و لاوازی نییە، لەبەرئەوەی قەفەسی نییە، چونکە چاوەڕوانی نیی، لەبەرئەوەی کە تۆمەتبارکردنی نییە؛ کە ڕوونکردنەوەو لێکدانەوەی نییە، کە ترس و لەرزی نییە، لەبەر ئەوەی ئۆقرەگرتن و تەحەمولکردنی نییە، چونکە کۆت و بەندی نییە، بۆوەی

مەرجی نییە، چونکە (گەڕانەوە)ی نییە، لەبەر ئەوەی (وەستان)ی نییە، چونکە (ڕۆیشتن)ی نییە، کە خۆڕاهێنان‌و (ریاضت)ی نییە، کە گەوجێتی نییە، کە تێنەگەیشتنی نییە، کە زەرورەت‌و بەرژەوەندی‌و سودو قازانج‌و (بۆچی)و (لەبەرچی)و داخوازی‌و ناکۆکی‌و پێکەوە گونجان‌و لێکدژی‌و کوفرو شیرك‌و گومان‌و سستی ئیمان‌و هەواو هەوەس‌و چێژو ئازار ...ی نییە، ئاگرەو، **نەك ئاگری ئەوین، ئاگری خۆشویستنە...**

خەریکبووم چیم دەگووت ؟

.....ئەسپ.... ها؟ بەڵێ، وتم هەندێ لە ڕۆحەکان وەك(ئەسپ)وەهان. هەر ئەسپێك خاڵێکی بزواندنی هەیە؛ هەدێجار ئەسپێك بە توندترین قەمچییەکان ناوچاوی لێڵ ناکات؛ ئەگەر نەشتەرێکیش بکەیت بە تەنیشتیدا هەر هەستی پێناکات، هەست دەکات بەڵام ناجمێت. هەروەك ئەوەی کە هەستی پێنەکات. بەڵام هەر هەمان ئەم ئەسپە یەك یان چەند خاڵێککی بزواندنی هەیە؛ بناگوێ، خاڵ یاخود چەند خاڵێك بە گەردنی، پشتی، سنگی، ژێر گەروی، کە بە بچوکترین ئاماژەی نوکی پەنجەتوتە. لە ناکاو دەردەپەڕێت و وەك باڵندەیەك کە لەپڕ

ڕاچەنێت، دەدات لە شەقەی باڵو
دەردەفرتێت. ئاوەها شێتانە دەداتەغار کە
هەر سوارچاکێکی کارامە دەدات بە زەویدا،
هەر کۆسپ و ئاستەنگێك تێدەپەڕێنێت کە
لەبەر دەمیدا قوت بێتەوە، تێدەفرتێت،
کەژوکێوو دەشتو دەرو دۆڵو شیوو
ڕووبارو گردو چاڵوچۆڵو دەریاو شارو
هەرچیو هەرکەسو هەر کوێیەك کە هەیە،
دەیبڕێتو لێیدەداتو دەیشکێنێو
هەڵدەداتو دەڕواتو دەڕواتو تاوەکوو...
هێزوبڕستی لێدەبڕێت، تاکو لە چاو ونبێت..
و من، هەست دەکەم ڕۆحم ڕۆحی ئەسپێکە،
نە لە ئەسپ نەویترو نەبانتر لە ئەسپ، بەڵام

نـەك ئەسـپی ئەسـپ وعەرەبانە، گالیسكە؛ و
نەك ئەسپی سواری و بە كرێدان. ئەسـپی بـێ
زین و لغاو، ئەسـپی چـەمووش و سـەركەش و
جووتەوەشێن و شێت و كێوی؛ نـەك كـە لغاو
نـەگرێت، بـەڵێ بـەڵام بە نارەحـەتی ، بە
مەترسـیـەوە، درەنـگ.. . ڕاسـتە،
ماندووكـەرە! بـەڵام ئەگـەر ئیمـانی ئـارام
لەبـەربڕاوو بێئـۆقرەی بەنـدیی زەوی _ كـە
شەوق و تاسـەی میعراج و هەڵكشانی هەیـەو
عەشـق وئەوینی دیـدارێك لەوبـەر
ئاسمانەكانەوە _ توانی لغاو بكات بەسەریداو
خۆی هەڵبداتە سەر پشتی و قەمچییەكی پڕ
ئێـشی قـسـەیەكی ئاشـنای بـۆ بـچڕێت،

گەردەلوولەکان لە پشت سەریەوە ون دەکات‌و وەپێش دەنگی هەورەتریشقەکانی ئاسمان دەکەوێت‌و، هەروەك تیر، پانتایی زەوی دەگرێتەبەرو بەسەر بەرزایی دیواری ئاسۆوە هەڵدەفڕێت بە سنگی بلورین‌و ناسکی سپێدەدا ڕۆدەچێت،و لە چاوتروکانێکدا، شازادەیەکی لەنێو کۆتی غولاماندا بێگانە_ کە نیازی هەڵاتن لە وڵاتی غوربەتی زەمین‌و ڕاکردن لە خێوەتگەی درندان‌و دوژمنانی ناپاك‌و قین لە دڵی ژێر ئەم ئاسمانەی هەیە،و لە ترسی دیلییەتی بەدەستی مامەڵەچیان‌و کۆیلە فرۆشانی ئەم ڕەشە بازارەدا، ئەڵهای خاك‌و وڵاتی خۆی

کــردووە_ بــە ســنوری جیهــانێکی دی دەگەیــەنێتو، بــە خێرایــی ئەزنــەکی ئاواتوئارەزوویــەك، دەیباتــە بەردەرگاکــەی خــۆی_ ئــەوێ جــێ کــە دەرو دیــوارو، دانیشتوانی هــەر هــەموویان خزمو خــوێشو کــەسوکارانی چــاولە ڕێــی ئــەون_؛ دەرگایــەکی بــەرز کــە کەبــە ســەر پانتــایی کوێــستانێکی لوتبــەرزەوە داچــەقاوە کــە نــەنگو شــورەیی هــیچ هــەنگاوێکی قبــوڵ نەکردووەو، خەوشیی هیچ نیگایەکی چڵكو نەگبەتو بریندارکەر نەکەوتووەو ئالوودەی زبڵدانی هیچ ( **تێگەیشتن**)ێکی تەسكو کوردو بۆگەن نەبووە.

## خۆشویستن لە ئەوین بانترە

کۆشکێکی گەورەو چۆڵو بێدەنگو شکۆدار، بەسەر داوێنی کێوێکی بەرزو دوورو سەرکەشو پڕ سامو هەیبەتو شکۆمەنددا، لەبەر پێیدا چاوگەیەکی هەڵقوڵاوی خۆرێك کە لە دڵی پڕ لە ڕازی غەیبەوە سەردەردێنێ، هەواکەیشی بۆندار لە خۆشترین عەترەکانی خۆشترین خۆشویستنەکانی خۆشترین ڕۆحەکانە...

لە کوێ؟

( ئەوێ کە ئێرە نییە)،

لە کوێ؟

ئەوێ کە زەوی‌و ئاسمانەکەیان هەر هەمووی لە ڕۆح دروستکردووە، پێکیان هێناوە؛ لە

ڕۆحی ئەو ڕاهیبە پڕ لە ڕازەی کە تەمەنێکی
لە نێو حەشیمەتی مەردمدا بەسەر بردو
کەس نەیناسیو وێنەی خۆی لە نێو چاوی
ئەو هەزاران دوورو نزیکە نەبینییەوە، کە
لێی کۆ بووبوونەوەو لێی ڕامابوون، تەنها
یەکجار، بە درێژایی ئەو ڕێگا دوورو درێژەی
کەبەم وشکە قاقڕەدا تێدەپەڕێت یەکجار، لە
دەرچەکانی پەرستگایەکی نەزانراوەوە لە
ناوەوەی ڕوانیو مەزارگەی شەهیدێکی
بزرناوی بینی کە لە ناویدا_ لە ژێر
منارەیەکی زێڕین کە بەوێنەی خەیاڵی
خواپەرستێك، کە تێکڕای تەمەن چاوی لە
ئاسمان بڕیوە_ ئەسپەردەبوو.

## خۆشویستن لە ئەوین باشترە

وێنەیەکی لە چوارچێوە ئاسنینێك گیراو بە سەر دیواری حەرەمەکەیەوە ئاوێزان کرابوو کە چاوی، بە حەسرەتو خەمێکی پڕ واتاوە، لە تابلۆی مەزارگەی شەهیدەکە بڕیبوو وەك بڵێی کۆمەڵێك دێڕی نوسراو لەسەر تابلۆکە دەخوێنێتەوەو وەها دەردەکەوت کە وێنەی کەسێکە کە لەگەڵ شەهیدێکی بزرناو کە لەناو دڵی گۆڕەکەدا ڕاکشاوەولێی خەوتووە، خزمێکی نزیکەو وەك بڵێیت تەنها ئەوە کە، لەم سەرزەویەدا، لەگەڵ ئەم ئەسپەردەکراوە بێ ناوونیشانەدا کە کەسێك نایناسێت، ئاشنایەو دەزانێت کێیە، چارەنووسی چییە،و بۆچی لێرەدا

شـــەهیدبووە؟و چـــۆن کوشـــتوویانە؟و چ
کەسانێك کوشتوویانەو لێرەدا بە خاکیان
ئەسـپەردە کـردووە؟و بۆچـی کەسـێك
بیرەوەریەکی لەبارەوە باس ناکات؟ بۆچی
لەنێو ئەو هەموو زیارەتکارانەی کە دێنو
لێرەدا (نەزرو نیاز)دەکەن؛ جگە لە منارە
جوانو قەشەنگەکەی حەرەمەکەی کە لە
دوورو نزیکەوە لێیدەڕوانن‌و ئەبڵەقی دەبنو
پەسنی دەڵێنو شکۆدارو پیرۆزی ڕادەگرن،
کەسێك شتێك نازانێت؟ کەسێك تەنانەت
ئەرکی خوێندنەوەی ئەو چەند دێڕەی کە
بەسەر ئەم تابلۆ بەردینەوە نوسیویانە
ناداتە بەرخۆی؟ بۆچی گڵکۆی ئەم شەهیدە

ئاوەها ئاوەدان و ڕازاوەو خەملێنراوەو خزمەتگوزارو شمەکی وەقفکراوو زیارەتکاری زۆرەو خودی ئەم شەهیدە کەسێك نایناسێت و کەسێك ناپرسێت کە ئەوەی لە ژێرئەم گومەزیە جوانەدا_ کە جیلوەی کاشیە قەشەنگ و گرانبەهاو گەچبڕی و هونەرمەندییە سەرنجڕاکێشەکانی چاوانی مات کردووە_ بە خاك ئەسپەردە کراوە کێیە؟ بۆچی شەهیدیانکردووە؟ چارەنووسی، خەم و خەفەت و ئێش و ژانی، ئایینی، ئیمانی، ڕۆژگاری و ژیانی پڕ خوێنی چی بووە؟ کەسێك ناپرسێت ئەم ئیمامزادە نەناسراوەی کە لە ژێر ئەم گومەزیەدایەو لە

شـەلاڵی خـوێنو تێیـدا خـەوتووە کێیـە؟ بۆچی؟ چۆنو بە تێغی کامە خەلیفە شـەهید کـراوە؟ خـاوەنی چ هـزرو بیرێـك هـەبووە؟ خاوەنی چ هەستو ئیحساسێك بـووە؟ داوای چی کردووە؟

و ڕاهیبەکـە_ کـە ئـەم بیرکردنـەوە پـڕ ئازارانە لە خۆیدا نغرۆی کردبووو دەسوتاو هەڵدەقرچا_ چاوی لـە چاوی پـەنجـەرەکانی مەزارگەی ئەم شـەهیدە نەناسراوە بڕیبووو نیگـای واق وڕمـاوی لـە نێـوان وێنـە هەڵواسراوەکەی سەر دیواری حەرەمو گۆڕی ئـەم شـەهیدەدا دەهـاتو دەڕۆیـشتو دەیپرسیو، لەم حاڵەدا، لـەناکاو هەستیکرد

کە ڕوخساری ئـەم وێنـە لەچوارچێوەگیراوە بەسەر دیـواری نـاوەوەی حەرەمـەوە ئاشـنا دێتە بەرچاوی! زیاترو زیاتر ڕوانیو تێڕامـاو بەسەرســـــوڕمانێکی بیمنـــــاك بـــــەڵام تاسـەبزوێنەوە بـینی کـە ئـەم وێنەیـە....... وێنەی خودی ئەو!

بەڵێ، ڕۆحی من ئەسپێکە. بەڵام حەیف کە لێرەدا کە منم، ئەسپی زیتو زرنگی عەرەبی بە ئاشگێڕەوە دەبەستنەوەو لەگەڵ ئەسپی گالیسکەدا هـاوزنجیری دەکـەنو لێـرەدا کـە مـنم، چەقبەسـتووان ئـازادو هـەڵاتووانو چەموشان لە نێو کۆتوبەندا!

((خشمناکان بی خروش‌و بی فغان   دردمندان بی فغان‌و بیخروش

باز ما ماندیم‌و شهر بی تپش        وآنچه کفتاراست‌و گرگ‌و روبه‌است

گـــاه میگویم فغانم برکشـم    باز می بینم صدایم کوته است...!

............................))لێگەڕێین.

ئەوین هەندێجار جێ گۆڕکێ دەبێت‌و هەندێجار سارد دەبێتەوەو هەندێکات دەسووتێت. بەڵام خۆشویستن لە جێگای خۆیدا، لە تەنیشت دوستەکەی خۆیدا؛ هەڵناسێت؛ سارد نابێتەوە چونکە داخ نییە؛ ناسوتێنێ چونکە سووتێنەر نییە.

ئـــەوین ڕووی لـــە خۆیـــەتی. خۆپەرســـت‌و(خۆپـــارێز)و بـــەدخوو،و لەپێناوخۆیدا مەعشوقەکەی دەپەرستێت‌و

ستایشی دەکات، بەڵام خۆشویستن ڕووی لەدۆستە، دۆستخوازو دۆست پارێزەو خۆی لەپێناوی دۆستدا دەوێتو ئەوی لەبەر ئەو خۆش دەوێتو خۆی لە گۆڕێدا نییە.

ئەوین، ئەگەر بێتو عاشق لە نێودا نەبێت، ئیدی(ئەوین) نییە. بەڵام لە خۆشویستن دا، جگە لە **خۆشویستن**و **خۆشەویست**، سێهەمێك بوونی نییە. ئەوین بە خێرایی دەگۆڕێت بۆ کینەو تۆڵەسەندنەوەو ئەو ساتەیە کە عاشق خۆی لەو نێوانەدا نابینێتەوە، بەڵام لە خۆشویستندا ڕێگایەك بەرەو ئەولا نییە.و هەرکات ئەوەی کە (**خۆشویستن**) باش

دەزانێت‌و باش هەست دەکات ، خۆی لە
نێودا نابینێتەوە، بە خێرایی‌و بەسادەیی،
دەگۆڕێت بۆ فیداکاری‌و لەخۆبووردوویەکی
سەرسوڕهێنەرو بێخەوش‌و گەورەو شکۆدارو
ئیبراهیم ئاساو لەم ساتەدایە کە خۆی کە
نییەو ئیدی ناتوانێت ببێت، لە ئاوێنەیەکدا
کە پێیخۆشە لەکە(پەڵە)یەك ناو لەخۆی
دەنێت‌و فەرمان دەدات_ واقیعی‌و دڵسۆزانە
لە ڕووی ئیمانێکی دڵنیا نەك ڕۆتینی‌و
خۆنواندنەوە؛ ئەمە هەم لە کاتی ووتنیداو
هەم بە جۆش‌و خرۆشی قسەیەوە دیارە_
کە:( ئەو پەڵەیە بەسەر ئاوێنەکەوە بسڕە!
تاوەکو ئاوێنەکە ئیتر ڕوخسارم لە خۆیدا

نـەبینێت، بێهـوودە خەوشـێك بەسـەر ڕوخـساریەوە نـەمێنێتو ئاوێنـەی پـاكو بێگـەردو بێخەوشـی تـۆ خەوشدار نـەبێت). بەڵام ئەوین دەڵێت:( ئاه! ئایا ئەم لەکەیە لەدوای من پاك دەکەیتەوە؟ ئایا لەکەیەکی تـر بەسـەر ئاوێنەکـەوە دەنیـشێت؟ ئایـا، لەمـەودوا، ڕوخـساری ئاوێنەکـە بـێ خـەوش دەبێـت؟ نـەخێر، نـەخێر، نـەخێر، لـە دوای مـن، سەرتاسـەری ئـەم ئاوێنەیـە ڕەش بکەرەوە. ئەم پەڵەیە پـان بکـەرەوە بەسـەر تێکڕای ئاوێنەکەدا!

جیوەی ئاوێنەکە هـەمووی بکرێنـە با ئیدی وێنەیـەکی تێـدا دەرنەکـەوێت. ئاوێنەکـە

خۆڵاوی بکەو خاکی ئازیەتی بەسەردا بپژێنە

تاوەکو ڕووناکی خۆری بەرنەکەوێت؛ تاوەکو

لە دوای مـن نەدرەخشێت، بریقـەی نەیـەت.

ئـاه! چـی دەڵـێم؟ ئاوێنەکـە بـشکێنە!

بشکێنە! بشکێنە!

جگەر گۆشەکەم، لەدوای من بەرۆکت دادڕە،

بـەردەوام سـەرو قـژت پەرێشان‌و پەخشان

بکـە. هـەرگیز بـزە نەخەیتـە سـەر لێـوت،

هەرگیز لەسەر جێگەی نەرم نەخەویت.

هەرگیز نەخەویت. بەردەوام پڵمە گریان بە.

هەردەم داخ‌و پەژارەی مـن لـە سـنگتدا نوێ

بکـەرەوە. لەسـەر گۆڕەکـەم هەڵمەستەوە.

مەگەڕێرەوە بۆ ماڵەکەت. لەبـەر مردنـی من

ژیانت بدە بە بادا. ڕۆحی من لە گۆڕەکەدا ئەشکەنجە دەچێژێت ئەگەر دەنگی پێکەنین و هەواڵی خۆشی و بەختەوەری و ئازادی تۆ ببیستێت. ئاه، لە ژێر بەردی ئەلحەددا بە شادی و خۆشی و ڕابواردنی خۆت ئازارم مەدە!

هاوسەرەکەم! کاتێک کە لە بەخۆشییەکەمەوە مردم و تەرمی بێ ئێش و بێگیان و بێ هەستمیان لە ئاگردا سوتاند، نەکەیت تۆ فەرامۆشم بکەیت. پاش کەمێک بگەڕێیەوە بۆ ناو شار. گۆڕستان بەجێبهێڵیت و بگەڕێیتەوە ماڵێ، بەبێ من ژیان و ئارامی درێژە پێبدەیت، ئاه کە

بەختیاری وکامەرانی تۆ لەدوای من چ بەدبەختییەکی گەورەیە بۆ من! تۆ. دەبێت ئەو دەمەی کە تەرمەکەی منیان ئاگر تێبەردا، خۆیشت_ هەرچەندە هێشتا لەسەرەتا دایت_ بەگڕی ئاگرەکەی من بسوتێنی تاوەکو لەدوای من، شتێك لە تۆ جگە لە خۆڵەمێشێك بەجێ نەمێنێت.

بەڵام خۆشویستن، لە ئەو هەموو جۆش و خرۆشەی ئیمان و ئاتاجییەیدا، دەستەدامێنی دەبێت و بە هێزی پێداگری و فەرمان و تکالێکردن، لەناو جێگەی سەرەمەرگی خۆیدا، داوا لە هاوسەرەکەی دەکات کە:

هاوسەرەکەم! تۆ هێشتاکو دەتوانی بیست

ساڵی دی بژی و دەتوانی هەناسە بدەیت،

هەست بکەیت، بیر بکەیتەوە، ژیان بکەیت،

حەزت هەبێت، ئەوین بکەیت، هاوسەریی،

هاوهەنگاویی، هاوڕازیی، هاوڕۆحی،

خوێشایەتی، سەرچاوەی هۆگری،

سێبەرێکی فێنک، بێستانێکی بەرامەدار

بدیەوە، بیست بەهار، بەبێ من، لە خۆشی و

شادی دابیت، بیست هاوین، بەبێ من، چێژ

لە سەرفەرو گەشت و دەریاو کوێستان و

کێو و ڕووبار وەربگریت. بیست پاییز بە

تێڕامانە قووڵەکان، بەهەستکردنە

ڕیشەدارەکان، بە خوێندنەوە، بە تێفکرین؛

بە خۆشویستن؛ بە ئەوین کردن، بە خەمخواردن، بە جوینەوەی بیرەوەریەوە خەریك بیت.

بیست ساڵی دی لە پشت پەنجەرەکانەوە دابنیشی و هاتنەخوارەوەی خامۆش و مات و سوکی بەفرەکان و جەنجاڵی نازی پەنجەکانی باران و قەمچی (با)کان بەسەر جەستەی ڕووتەڵی درەختەکانەوە و نرکەو ناڵەی (با)کان لە ژێر خێوەتەکانەوە ببیستی؛ ببینی، شەوانی ڕەش و درێژو بە تاقەتی زستانەکان، دەرگاکانی ژوورەکەت دابخەیت و پەردەکان دابدەیتەوە و لە تەنیشت زۆپا داخ و گەرم و خۆشەکەوە

دابنیشی‌و چاو لە یاری توندی‌و جوان‌و پڕ لە
ڕازی بزوسـکـە بـێ ئـۆقرەو بزێوەکـانی
ئاگرەکە_ کە لەگەڵ دڵی تۆدا قسە دەکەن_
ببڕیـت‌و چـەندین کاتـژمێر بـە دیـار
تەماشاکردنیەوە دابنیشی‌و نیگات لەسـەمای
ئەفسوناوی ئـەو وەرنـەگێڕی‌و، لـەو حالـەدا،
باڵندە کێوییـەکانی خـەیاڵت بەردەیتـە دەرو
بیانـدەی لەشـەقەی بـاڵ‌و بـەرەو لای
بیرەوەرییە خۆش‌و شیرین‌و بەرامـەدارەکانی
ڕابردووەکان‌و ئاواتە پـڕ تاسـەکان‌و چاو لـە
ڕێـی ئاینـدەکانت بڕوانـی تـاوەکو بـڕۆن‌و
بگـەڕێن‌و هـەر چرکەسـاتێك پەیامگـەلێکی
شیرین‌و هەواڵگەلێکی وروژێنـەرت بـە دیاری

بۆ بهێننو بزە نەرمەکانی بیرەوەری ڕەنگو شیرینو خۆشی لێوەکانت، لە سێبەری سەماکەری ئاگرەکەدا، پشکوێتو سنگی ئەو دوو ماری خەتو خاڵدار کە لە ئامێزی یەکتردا چوونەتە خەو، لە خەوە خۆشو شیرینەکان وەجۆشوخرۆش بهێنین... بەڵام هەرگیز، یەکێك لەم باڵندانە، بۆ سۆراخکردنی من، نەدەی بەم گۆڕستانەدا کە دڵی من دەڕەنجێنیو ڕۆحی من کە_لە قوڵایی تاریکیی مەرگهێنەرو قورسو خامۆشی گۆڕستاندا، لەبەر تیشکی لەرزۆکی ئاگرەکەدا لە ڕوخساری تۆ دەڕوانیو بە چێژەوە تەماشای سەمای سێبەرەکان

بەسەر ئەگریجەو تەوێڵو سنگو ئەندامو
جلوبەرگی تۆوە دەکات_ ئەگەر ببینێت
کە، لەو حاڵەتەدا کە خامۆشو لە تەنیشت
ڕۆپاکەدا بێدەنگ دانیشتویتو سەرگەرمی
نوێکردنەوەی بیرەوەریەکانو
پەروەدەکردنی ئاواتەکانی، تەماشای یاریی
پریشکەکانی ئاگرەکە دەکەیتو جار جار؛
هاتنی بیرەوەری یان ئاواتێکی زۆر شیرینو
خۆش ختووکەت دەداتو سەرت بە لایەکداو
شانت بەلایەکی دیدا لار دەکاتەوە،
خەندەیەکی نەشئەهێنو خەست، لێوەکانت
کە بە نارەحەتی بەرگری دەکەن بەسەر
تەواوی دەم و چاوتدا بڵاو دەکاتەوەو نازانم

ئەو بیرەوەری یاخود ئاواتە چییە کە، لە هەمان کاتدا، چاوەکانت لە تاو تەریقبوونەوەیەکی ناسكو نەرم بەسەریەکدا دەنێیتو ڕوخسارت لە شەرمێکی شیریندا سوور هەڵدەگەڕێتو وەك ئاگر گوڵ دەکات و لە ناکاو لە جێدا بێهوودە هەڵدەپەڕیتو دووبارە خێرا دادەنیشیتەوەو هەمدیسان باڵندەیەك لەو باڵندانەی کە ڕەوانەی سەرزەمینەکانی ڕابردوو یان ئایندەت کردبوو، دیاریەکی تازە دێنێتو چیرۆکێکی دی ساز دەکاتو دیسان بزەیەکی ناسك وەك پشکوتنی گوڵێك لە بەرامبەر خۆردا یان ترپەی سنگی تولە مارێك یاخود شەپۆلێکی

نەرم بەسەر ڕووخساری بێگەردی ئاوەوە_
ئارامی لێوەکانت بەیەکدا دەدات‌و من کە
دەبینم تۆ نوقمی چیرۆکە شیرینەکانی‌و
ئاواتە ڕەنگینەکان نەوازشت دەکەن‌و
بیرەوەریە جوان‌و خۆشبۆنەکان ختووکەت
دەدەن؛ بە وێنەی چاوەکانی باوکێکی
تامەزرۆ کە جگەرگۆشە ئازیزەکەی بەسەر
تەختی زاوایەتی یان بووکێنییەوە دەبینێت‌و
نوقمی چێژو خۆشی‌و بەختەوەری،
چاوەکانی من لەناو بیلبیلە قووڵ‌و لە چاو
خاڵییەکان‌و پڕ لە خاك، لە قوڵایی تاریکیی
گۆڕدا، بریسکە دەدات‌و کاسەی سەرم، لە
شەوق‌و تاسەدا، دەدات بە سەقفی

ئەلحەدەکەداو دڵم کە پوتورکاوەو سنگم قەفەسێکی خاڵییە کە باڵندەکەی مردووە، بەڵام پەراسووەکانی قەفەسە ئێسقانییەکەی سنگم، لەتاو شیرینیو خۆشی چرکەساتەکانی تۆدا، لێك دەترازێنو ئەگەر لەنێو بێدەنگیی قورسو ڕەشو ئارامی گۆڕستاندا بیت، دەنگی ئێسکەکانی ئێسکە پەیکەریەکە بە باشی دەبیستیت.

بەڵێ ، ئەگەر لەم حاڵەتەدا ڕۆحی من ببینێت کە لە پڕ باڵندەیەکی غەمگین هاتو چیرۆکێکی دەستپێکرد کە تۆ ئەبرۆکانت وەك ئەو کاتەی کە، لە بەرامبەر ڕووداوێکی

لە ناکاوو سەیرەوە قەرار دەگرن، بەرزکردەوەو چاوەکانت کە هەروا هەر لە ئاگرەکە بڕیوە، ئەبڵەقتکردو بزوسکی خەمێکی پڕ داخی لێدەرچوو؛ چەند دڵۆپێکی تەواوەی داخ و ئاخ سەمای ئاگرەکەی لە نیگاتدا تاریک و شێواو دەخاتە لەرزەو جێپێکانی خەمێکی قووڵ بەسەر تەوێڵتەوە نیشت و لێوەکانت باریان گرت و سەرت کەوتە سەر شانەکانت و هەردوو دەستەکانت کەوتە سەر ئەژنۆکانت و من سێبەری قورسی داخێکی تاڵم بەسەر ڕووخسارتەوە بینی و زانیم کە ئەو باڵندەیە چیرۆکێک لەمەڕ منەوە دەگێڕێتەوەو بەلای

خەمخانە تەنهاکەی مندا گوزەری کردووە.

ئەم گۆڕستانە پان و بەرینەی کە _ هەروەك دونیا، لە تەنیشت هەزاران دراوسێ و هاونیشتمانیدا، تەنها و بێدەنگ و نامۆ و بێ ئاشنا، شەوان و ڕۆژانێك بەڕێدەکەم کە ئیدی هەردووکیان وەك یەك وایە _ زۆر پەرێشان دەبم و ئێش و ژان جەستە ئێسکییەکەم دادەگرێت و تۆ نازانیت کە، لەم حاڵەدا، **کەسێك کە گەروویەکی بۆ هاوارکردن نییە، دڵێکی بۆ یاخیبوون نییە، زمانێکی بۆ ووتن نییە و قاچێکی بۆ ڕۆیشتن نییە، پەنجەیەکی بۆ نوسین نییە**، دەستەوسان و کلۆڵ و داماوە و، سەرتاپا، بووە بە ئێسکە

پەیکبەرێك لــە دەستەوســانی، بــووە بــە
تۆپەڵێك ئێسقان لە زەبوونیو بێدەسـەڵاتی؛
سنگی، ئەنـدامی؛ سـەری، قەفەسێکە کـە
تیایدا جگە لە هەوا کێوییەکانی تـرسو لـەرز
نییەو هەواکەیشی تێدا نامێنێتەوەو جگە لـە
خـاكو هــەواو ئێـسك، شـتێك نییــە... تـۆ
نازانی، تۆ نازانی ئەی کانیاوی لێوان لێوو بە
جۆشی ژیان، ئەی سەرتاپا ڕۆحـی لێـوان لـە
زیندەگیو ژیانو گـەنجیو جـۆشو خـرۆشو
شــادی! ئــەی کــە دەتویـــست مـــن لـــەو
دونیایـەدا، لـە دونیـای جموجـوڵو چـالاکیو
هـاوارکردنو ووتـنو گـوێگرتنو تووڕەبـوونو
ڕۆیـشتنو خۆشویـستیو میهـر بەخـشینو

بێقەراری و لێدانی دڵ و چاوەڕوانیکردن و یاخیبون و بێتاقەتی و خەندە و گریان و ئاوات و ئارەزووو بیرەوەری و هەناسەدان و بە پێ ڕۆیشتن و دووری و هەڵاتن و نزیکی و دووڕەپەرێزی و تین و تاوو گوڕو تین و ترس و ئومێد.... _ کە ئەمێستا هەر هەمووی لە تەنیشتمدا، لە دووتوێی کفنەکەمدا، لەگەڵ مندا بە خاک ئەسپێردراوە _ ژیان ببەخشی و زیندوێتی فێر بکەیت و ئەو بەهەشتەی کە دایکی ناشیمان لە ئاسماندا دەستی لێبەرداو ئێمەی خستە ئەم تاراوگە ناشیرینە بێگانەیەوە؛ بیهێنیتە سەرزەوی؛ بەڵێ تۆ ئەی لێوان لە (بوون) و توانین و هەستکردن و

لێدانی دڵو ئەی پڕ لە ژیان، ئەی لێوان لە (بوون)! تۆ نازانی، کە بۆ ئەم دۆستەی تۆ_ کە هەنووکە جگە لە قەفەسێکی ئێسکینەی کە پڕ لە هەوایە نییەو بەسەر سنگی قرۆڵو بۆشیەوە بەردێکی قورسو بێبەزەیی ئەلحەدیان داناوە..._ ئای ئێشوئازار کێشان چەندە سەختە!

بۆ ئەو کەسەی کە ناڵەیشی لە دەست نایەت، کە گەرووی هاوارکردنی نییە، دڵی یاخیبوونی نییە، چی دەڵێم؟ تەنانەت ناتوانێت بلەرزێت، ناوچاو بەیەکدا بدات، ناتوانێت لەم خەڵوەتە مەرگبارە

تەنهاییەدا، تەنانەت مشت بە ناوچاوانی خۆیدا بماڵێت، ناتوانێت تەحەممول بکات، ناتوانێت.... بگری... نازانیٚ ئازارکێشان بۆ ئێسکە پەیکەرێك چۆن سەختە! تاکویٚ سەختە!

نازانی گریان، بۆ ئەو کەسەی کە بیلبیلەی چاوی جگە لە دوو چاڵی قووڵو گەورەی پڕ لە خاك نییە، چەندە مایەی ڕەنج و ژانە! چی دەڵێم؟ ڕەنج؟ ژانو ئازار؟ سەخت؟ ئەم ووشانە هینی زیندووەکانن، هینی دونیای پڕ لە (توانین)ن، پڕ لە (بوون)و پڕ لە (ژیانکردن)ن. لێرە هیچ

ووشەیەک توانای قسەیەکی نییە، هیچ ووشەیەک، هیچ زمانێک کارێکی لەدەست نایەت، چی بڵێم؟ جگە لەم ئەندازەیەی کە من مەڕەنجێنە، لێرەدا مەمڕەنجێنە، لێرەدا من هەردەم نیگەرانی تۆم[1]، جگە لەمە لەبیری هیچدا نیم، کە نەکات لە بەرامبەری ئاگەرکەدا، ئەو ساتەی کە بەتاقی تەنها چاوت لە شۆڵەو پرشنگە چالاکو سەماکەرەکانی ئاگرەکە بڕیوەو باڵندەکانی خەیاڵت بەدەوری سەرتدا لە پەروازدان و یەک بەیەک چیرۆکێکیان بۆ ساز کردوویت، لەپڕ

(١) وەك مەولەوی تاوگوزی دەڵێت:

سۆچنۆم حەسرەت دەرد جیاییت      نەك چون بڵێسەی یاد تەنیاییت... وەرگێڕ

لێوە تێراوەکانت و چاوە پرشنگدارەکانت و ڕووخساری پاراوو گەنج و لێوان لە ژیانت، لە چیرۆکێکی تاڵ بژاکێت. من، لێرەوە، نابێت جگە لە ختووکەی پەیتاپەیتای بیرەوەرییە شیرین و ئاواتە خەیاڵ وروژێنەرەکانی ئاوێتە لەگەڵ شەرم و تاسەو نەوازشدا، لە تۆدا حاڵەتێکی دی ببینم. من لێرەدا، لەم تەنهاییە جاویدان و بێدەنگەمد، ئارام بهێڵە! تۆ بیست ساڵی دی بەبێ من، دەبێت دەست لە ئامێزی چرکەساتە لێوان لێوەکان لە (بوون)و ژیانکردن؛ ببیت و ژیان بکەیت، ببیت و ژیان بکەیت ... ببیت و بژیت... بەڵێ ببیت و بژیت.... لەبەرئەوەی خۆشویستن لە

ئەوین بانترەو من، هەرگیز، خۆم تاوەکو ئاستی بڵندترین لوتکەی ئەوینە بڵندەکان، ناهێنمە خوارەوە.

پەروەردگارم، میهرەبانی من
لە دۆزەخی ئەم بەهەشتە، ڕەهام کە!
لێرە ڕا هەر درەختێک بۆ من بەژن و باڵای جوێنێکە
و هەر ورتەورتێک، دەنگی شینێکە
و هەر دیمەنێک بێدەنگییەکی تەماوی‌و بێبەرهەم...
لە نێو ترس و بیمدا هەناسەدەدەم
لە بێئۆقرەییدا دەژیم
و بەهەشتەکەی تۆ، بۆ من، بێهوودەییەکی ڕەنگینە
من لەم بەهەشتەدا،
هەروەک تۆ لە نێو ئاپۆڕەی دروستکراوە
ڕەنگاو ڕەنگەکانتدا... تەنهام.
تۆ دڵی بێگانە دەناسی، کە خۆت لە وڵاتی (بوون)دا
بێگانە بووی
((کەسێکم بۆ بخولقێنە تاکو لەودا ئارام بگرم))
دەردم، دەردی ((بێکەسی)) بوو

د. عەلی شەریعەتی

2010

بەرگ
زانیار هەڵەبجەیی